# سوننەتەکان

## سەد سوننەت لەژیانی موسڵماناندا

# 100


ئامادەکردنی

ناصح فتاح نصر الله



١٤٢٧ك ٢٠٠٦ز

فتاح نصرالله ناصع، ۱۹٦۸ م.
سوننەتەکان / ئامادە کردنی، ناصع فتاح نصرالله. -- تهران: احسان، ۱۳۸۵.
۸۰ ص.
ISBN: 964-356-255-7
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
۱. سونت ـ اذکار شبانه‌روزی ـ دعاهای پیامبر.
۹س ۴ق / ۴ / ۲۲۵ BP ۲۹۷/۴٦۴
کتابخانه ملی ایران ۳۴۷۳۲ ـ ۸۵م

# سوننەتەکان

✦ئامادە کردنی: ناصح فتاح نصرالله
✦بڵاوکار: نەشری ئیحسان
✦ساڵی چاپ: یەکەم ـ ۱٤۲۷-۲۰۰٦
✦تیراژ: ۳۰۰۰ دانە
✦چاپ: چاپخانەی مەهارت
✦ژمارەی سپاردنی: (   )ی ساڵی (   )ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

**فروشگاه شمارهٔ ۱:** تهران ـ خیابان انقلاب ـ روبروی دانشگاه ـ مجتمع فروزنده ـ شمارهٔ ۴۰۶ ـ تلفن: ۶۶۹۵۴۴۰۴
**فروشگاه شمارهٔ ۲:** تهران ـ خیابان ناصر خسرو ـ کوچه حاج نایب ـ شمارهٔ ۱/۱۱ ـ تلفن: ۳۳۹۰۲۷۵۰
صندوق پستی: تهران ۳۸۵ ـ ۱۱۴۹۵




ISBN: 964-356-547-5
ژمارەی نێونەتەوایەتی: ۹٦٤-۳٥٦-٥٤۷-٥



# پێرستی بابەتەکان

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|

# پێشەکی

ا لحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله سيدنا ونبينا محمد وعلى اله ومن والاه وبعد ......

خۆڕازاندنەوە بە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکە لەئەرکەکانی سەرشانی هەموو موسوڵمانێك ، پێویستە لەسەر هەموو باوەڕدارێك ئافرەت بێت یان پیاو سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا پەیڕەوی بکات ، ئەویش بۆ زیاتر بەهرەمەندبوون لەپیغەمبەری پێشەوامان ﷺ وەبۆ ئەوەی زیاتر خێر و بەرەکەت بکەوێتە تەمەن و ماڵ و خێزانمان .

پەیڕەوی کردنی ئەم سوننەتە پیرۆزانە ، لەڕاستیدا دیاری کردنی هەڵوێستی موسڵمانە بەرامبەر : دۆست و دوژمن ، خێر و شەڕ ، لەش ساخی و نەخۆشی ، خۆشی و ناخۆشی ، بەلاو بەرەکەت ، ژیان و مردن ، مانەوە و سەفەرکردن ، تەنیایی و هاوسەر گرتن . . .بەڵکو دیاری کردنی هەڵوێستە بەگشتی بەرامبەر مرۆڤ و بونەوەرو گیانلەبەران .

بەهۆی پەیڕەوی کردن و تێگەیشتن لەو سونەتانەیە نەك تەنها لەگەڵ مرۆڤدا بەڵكو لەگەڵ بونەوەریشدا هەست بەخۆشەویستی و دۆستایەتی و هاوڕێ یەتی دەكەیت .

جێ بەجێكردنی ئەم سوننەتە پیرۆزانە ، دەبێتە هۆی بەدەست هێنانی خۆشەویستی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ، و پاك بونەوە لەگوناهەكان و بەرزبونەوەی پلەی دونیا و قیامەت ... چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی مژدەی داوە بەو خێرە زۆرە و بەو پاداشتە گەورانە .

ئەم نامیلكەیەی بەردەستت - گەرچی كۆی هەموو سونەتەكان نیيە - بەڵام كۆمەڵێك سونەتی جوان و قەشەنگی لەخۆ گرتوە ، پێویستە گشت لا ئاگاداربین لێیان ، بەنیازی ئەوەی زیاتر خۆمانی پێبڕازێنینەوە و بەهرەمەند بین لەپێغەمبەری خوا ﷺ لەدنیا بەم سوننەتە پیرۆزانە و چەندین شتی بەسوودی تریش .. ولەقیامەتیشدا بەشفاعەتی خۆی .

داواكارین لەخوای گەورە كارمان ڕاست بكات و دڵسۆزیمان پێ ببەخشێت لەهەموو كارو فرمانێكدا .

**امين والحمد لله رب العالمين**

**٦/ ی رەمەزان ١٤٢٠ بەرامبەر ١٤/١٢/ ١٩٩٩**

# لەکاتی هەستان لەخەو

### ١- لەکاتی هەستان لەخەو بڵێ :

﴿ الحمد لله الذي احيانا بعدما اماتنا واليه النشور ﴾ متفق عليه

( سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندوی کردینەوە پاش ئەوەی مراندبونی – واتە نوستن – وەهەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە).

### ٢- لەکاتی چوونە سەر ئاودا : پێی چەپ پێش بخرێت و بوترێت :

﴿ اللهم اني اعوذ بك من الخبث والخبائث ﴾ رواه الشيخان

( خوایە پەنات پێدەگرم لەهەموو شەیتانێکی نێر و مێ).

### ٣- لەکاتی هاتنە دەرەوە لەسەر ئاو : پێی ڕاست پێش بخرێ و بوترێ :

﴿ غفرانك ... الحمد لله الذي اذهب عني الاذى وعافاني ﴾

رواه اصحاب السنن الا النسائي

( خوایە گیان داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەم ... سوپاس بۆ ئەو خوایەی ناڕەحەتی و ئازاری لێ دوور خستمەوە و لەش ساغی پێ بەخشیم ).

# کاتی پۆشاك لەبەر کردن

### ١- لەکاتی پۆشاك لەبەر کردندا :

﴿ اللـــهم اني اسألك من خيره وخير ماهو له ، وأعوذ بك من شره وشر ماهو له ﴾ رواه ابن السنى

( خوایە گیان داوای خێری ئەم بەرگ و پۆشاکەت لێدەکەم وەئەم خێرەیشی بەمەوە پەیدا دەبێت ، وەپەنات پێ دەگرم لەشەڕو ئاژاوەی ئەم بەرگ و پۆشاکە، وە ئەو ئاژاوەشی بەمەوە پەیدا دەبێت ).

## ٢- لەکاتی پۆشاکی تازە لەبەرکردندا :

﴿ الحمـــد لله الـــذي كـــســـاني هذا ورزقنيه من غير حـــول مني ولاقوة ﴾ رواه ابن السنى

( سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەم بەرگەی پۆشیم و پێی بەخشیم بێ هەوڵ و تێکۆشانی من ).

## ٣- گەر کەسێك پۆشاکی نوێی لەبەرکرد پێی بڵێ :

﴿البس جديدا وعش حميدا ومت شهيدا سعيدا﴾ رواه ابن ماجه وابن السنى

(یاخوا پۆشاکی نوێ بپۆشی و ژیانێکی خۆشی بەریتە سەر و بەشەهیدی و دڵخۆشی بگەڕێیتەوە بۆلای خوا ).

## ٤- لەکاتی دانانی جل و بەرگدا بڵێ :

﴿ بسم الله الذي لااله الا هو ﴾ رواه ابن السنى

( بەناوی ئەو خوایەی کەتاك و تەنهایەو بێ هاوەڵە).

# چونە دەر لەماڵ و گەڕانەوە

## ٥- کاتی چوونە دەر لەماڵ بڵێ :

﴿ بسم الله توكلت على الله ولاحول ولا قوة الا بالله ﴾

حديث حسن رواه ابو داود والترمذي و النسائي

( بەناوی خوا پشت و پەنام هەر خوایە وەهیچ جوڵە و گۆڕان و هێزێك بەبێ وویستی خوا نابێت ).

### ٦- لەکاتی هاتنەوە بۆ ماڵ و چوونە ژوور دا بڵێ :

﴿ اللـــهم اني اسالك خير المولج وخير المخرج ، بسم الله ولجنا وبسم الله خرجنا وعلى الله ربنا توكلنا ﴾

رواه ابوداود باسناد صحيح

( خـوایە گـیان داوای باشـترین و خێرتـرین هاتـنە ژوور و چـوونە دەرت لێ دەکـەم ، بەناوی خوا هاتینە ژوور بەناوی خواش چووینە دەر ، وەتەنها پشت و پەنامان هەر بەخوا دەبەستین ).

## خەوو پشوودان

### ١- لەکاتێکدا چوویتە جێگای خەوتن بڵێ :

﴿باسمك اللهم أموت وأحيا ﴾ متفق عليه

( خوایە گیان بەناوی تۆووە دەمرم و زیندووش دەبمەوە).

وە ئایەتەل کورسی بخوێنێت.وەیان بڵێ :

﴿ باسمــك ربي وضـــعتُ جنبي وبك أرفعهُ ، ان امسكت نفسي فارحمها، وان أرسلتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين ﴾

رواه البخاري ومسلم

( بـەناوی تـۆ خـوایە ڕاکشام ، وەهـەر بـەناوی تـۆ هەڵ دەستم، خـوایە گـیان گـەر گـیانت کێشام ڕەحمی پێبکە گەر نەشت کێشا ئەوا بیپارێزە بەوشێوەیەی بەندە چاکەکانی خۆت دەپارێزیت).

## ٢- لەکاتی خەو زڕاندا بڵێ :

﴿ اللهم غارت النجومُ ، وهدأت العيون ، وانت حي قيوم لاتاخذك سنة ولانوم ، ياَ حي ياقيوم اهدئ ليلتي وانم عيني ﴾ رواه ابن السنى

( خوایە گیان ئەستێرەکان دەرکەوتوون وەچاوەکان هێمن و خەوتوون ، تۆش زیندوو باڵا دەستی وەنەوز و خەو نات باتەوە ، ئەی ئەوەی هەر زیندو بێ پێویستی شەوم بۆ هێمن بکەرەوە و چاوم خەو لێبخە ).

## ٣- لەکاتی ڕاچڵەکین لەخەودا بڵێ :

﴿ اعوذ بكلمات الله التامة ، من غضبه وشر عباده ، ومن همزات الشياطين وأن يحظرون﴾ رواه ابوداودوالترمذي وابن السنى وقال الترمذي : حديث حسن

( پەنادەگرم بەوتە ڕاست و تەواوەکانی خوای گەورە لەتوڕەیی خۆیی و شەڕی بەندەکانی ، وەهەروەها لەوەسوەسەی خەتەری شەیتانەکان و لەوەش کە ئامادەبن).

## ٤- لەکاتی بینینی خەودا هەڵویستمان چۆن بێت :

(پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دەفەرموێت : ﴿ گەر هەرکەسێك لەئێوە خەونێکی بینی پێی خۆش بوو ، ئەوە ئەو خەوە لەلایەن خواوەیە و سوپاسی خوای لەسەر بکات ، ئینجا باباسی بکات — لەڕیوایەتێکیشدا — با تەنها بۆ خۆشەویستانی بگێڕێتەوە، خۆئەگەر خەونێکی ناخۆش بوو بەلایەوە ، ئەوە لەلایەن شەیتانەوەیە با پەنا بگرێت بەخوای گەورە لەشەڕی ئەو خەونە، باباسیشی نەکات بۆ هیچ کەسێك ﴾ بەم شێوازە بەهیچ شێوەیەك زیان ناگەیەنێت ). رواه البخاري

# دەست نوێژ گرتن

## ١- لەسەرەتای دەست نوێژ گرتندا بڵێ :

﴿ بسم الله ﴾ رواه ابوداود وابن ماجه واحمد

( تەنها بەناوی خوا )

## ٢- لەکاتی دەس نوێژ گرتندا بڵێ :

﴿ اللهم اغفر لي ذنبي ، ووسع لي في داري وبارك لي في رزقي ﴾

رواه النسائي وابن السنى باسناد صحيح

( خوایە گیان لەگوناهم خۆش بە ، وەماڵم فراوان بکە، بەرەکەتیش بخەرە رزق و ڕۆزیمەوە) .

## ٣- پاش تەواو بوونی دەس نوێژ بڵێ :

﴿ اشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له واشهد ان محمداً عبده ورسوله ، اللهم اجعلني من التوابين واجعلني من المتطهرين ، سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لااله الا انت استغفرك واتوب اليك ﴾ رواه مسلم و الترمذي

( شایەتی و گەواهی دەدەم کە خوا تاك و تەنها و بێ هاوەڵە وەگەواهی دەدەم کە( محمد ) ﷺ بەندە و پێغەمبەری خوایە ، خوایە گیان بمخەرە ڕیزی تەوبە کاران و ڕیزی پاك و خاوێنەکانەوە ، خوایە گیان پاك و بێگەری بۆ تۆ ، سوپاس هەر بۆ تۆیە ، شایەتی دەدەم پەرستراو هەر تۆیت ، وەداوای لێخۆش بونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆلای تۆ ).

## چون بۆ مزگەوت

### ١- لەکاتی چوون بەرەو مزگەوتدا بڵێ :

﴿ اللهم اجعل في قلبي نورا ، و في بصري نوراً ، وفي سمعي نوراً ، وعــن يمـيني نوراً ، وعن يساري نوراً ، وفوقي نوراً وتحتي نوراً ، وأمامي نوراً وخلفي نوراً ، واجعل لي نوراً﴾ رواه البخاري و مسلم

( خوایە گیان نور بخەرەرە ناو دڵمەوە وەنور دابنێ لەچاومدا ، وەنور بخەرەو ناو گوێمەوە وەنور دابنێ لەڕاست و چەپمدا وەلەسەرەو خوارەوە نورم بدەیتێ ، وەلەپێش و پاشەوەش نورم پێ ببەخشیت ، وەخوایە گیان نورم پێ ببەخشە).

### ٢- لەکاتی چوونە ناو مزگەوتدا : قاچی ڕاست پێش بخە و بڵێ :

﴿ بيسم الله والسلام على رسول الله ، اللهم اغفرلي ذنوبي ، وافتح لي أبواب رحمتك ﴾ رواه مسلم وابو داود وابن السنى

( بەناوی خوا ، سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ، خوایە گیان لەگوناهەکانم خۆش ببە و دەرگای ڕەحمی خۆتم لێ بکەرەوە).

### ٣- لەکاتی هاتنە دەرەوە لەمزگەوت : قاچی چەپ پێش بخە و بڵێ :

﴿ بسم الله والسلام على رسول الله ، اللهم اغفر لي ذنوبي وافتح لي ابــواب فضلك ﴾ رواه مسلم وابوداود والنسائي بأسانيد صحيحة

(بەناوی خوا سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ خوایە گیان لەگوناهەکانم خۆش ببە و دەرگای فەزل و خێرم لێبکەرەوە).

# بانگ گوتن

## ١- لەکاتی بانگ وتندا :

﴿ قال رسول الله ﷺ اذا سمعتم النداء فقولوا مثل مايقول المؤذن ﴾ متفق عليه

( هەرکاتێ گوێتان لەبانگەوەبوو ئێوەش وەك بانگ بێژ بیڵێنەوە) لەڕیوایەتێك دا دەفەرموێت : (ئەگەر بانگ وێژ ووتی: (الله اكبر ، الله اكبر) وەیەکێش لەئێوە ووتی ( الله اكبر، الله اكبر ) پاشان ووتی (اشهد ان الا اله الا الله ) ئەویش وتیەوە (اشهد ان لا اله الا الله ) ، پاشانیش بانگ بێژ ووتی : (اشهد ان محمداً رسول الله ) ئەویش ووتی ( اشهد ان محمداً رسول الله )، پاشانیش ووتی : ( حي على الصلاة ) ئەویش ووتی: ( لاحول ولا قوة الا بالله ) پاشانیش ووتی ( حي على الفلاح ) ئەویش ووتی ( لا حول ولا قوة الا باله ) ، پاشانیش ووتی ( الله اكبر الله اكبر ) ئەویش ووتی : ( الله اكبر الله اكبر ) پاشانیش بانگ بێژ ووتی ( لااله الا الله ) ئەویش ووتی ( لا الە الا الله ) لە دڵەوە ئەوا ئەو کەسە دەچێتە بەهەشتەوە) رواه مسلم وابوداود

## ٢- دوای بانگ بلێ :

﴿ اللهم رب هذه الدعوة التامة ، والصلاة القائمة ، اتِ محمداً الوسيلة والفضيلة ، وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته ﴾ رواه البخاري

( ئەی خوای ئەم بانگەوازە تەواو ئەم نوێژە ڕاست و دروستە، پلەی ( الوسیلە ) ی بەهەشت ببەخشە بە (( محمد )) ﷺ و وەهەروەها پلەی (( محمود )) ی سوپاس گوزاری پێ ببەخشە کە خۆت پەیمانت پێ داوە) . هەرکەس ئەم دوعایە دوای بانگ بڵێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەری خوا دەکەوێت.

# پێش نوێژ کردن

**١- لەکاتی نوێژدا : هەرنوێژێك بێت قامەت بکە بۆی بەم شێوەیە :**

﴿ الله اكــبر، الله اكبر ، اشهد ان لااله الا الله ، اشهد أن محمداً رســول الله ، حــي علــى الصلاة ، حي على الفلاح ، قد قامت الصلاة، قد قامت الصلاة ، الله اكبر الله اكبر لا اله الا الله ﴾

## حديث صحيح

**٢- تەسبیحاتی پێش نوێژ :**

﴿ عــن ام رافع رضي الله عنها أنها قالت : يارسول الله دلّني علي عمــل ياجرني الله عزوجل عليه ؟ ! قال : يا ام رافع اذا قمت الى الــصلاة فسبحي الله تعالى عشراً ، وهلليه عشراً ، وأحمديه عشراً ، وكبريه عشراً ، واستغفريه عشراً ، فانك اذا سبحت قال : هذا لي ، واذا هللــت قال : هذا لي ، واذا حمدت ، قال : هذا لي اذاكبرتِ قال : هذا لي ، واذا استغفرتِ قال : قد فعلتُ ﴾

رواه ابن السنى وقال الحافظ ابن حجر بعد تخريجه : حديث حسن

(دەیگێڕنەوە لەدایکی ڕفیعەوە ڕەزای خوای لێبێت فەرموویەتی : (ئـەی پێغەمـبەری خـوا کـردەوەیەکم پێبلـچێ کەخـوای گـەورە لەسـەری پاداشـتم بداتـەوە . پێغەمبەریش فەرمووی : ئەی دایکی رافـیع هەرکاتـێك هەسـتایت بـۆ نـوێژ کـردن دەجار ( سبحان الله ) بکـە، وە دەجـاریش ( لا اله الا الله ) بکـە وەدەجار ( الحمد لله) بکـە، وە دەجـار (الله اکبر) بکە ، وەدەجاریش (استغفر الله) بکە. چونکە هەرکاتێك وتت : (سبحان الله ) خوا دەفەرموێت : ئەوە بۆ مـن وەکاتـێك وتـت ( لا اله الا الله) دەفەرموێت : ئەوە بۆ من، وە کاتێك وتت : (الحمد لله) دەفەرموێت : ئەوە بۆ من ، وەکاتێك وتت ( الله اکبر ) دەفەرمـوێت : ئـەوە بـۆ من ، وەکاتێك داوای لێخۆش بوونت کرد و وتت : (استغفر الله) خوای گەورە دەفەرموێت : ئەوە بەدڵنیاییەوە لێت خۆش بووم ) .

### ٣- کاتێك چویتە ڕیزی نوێژ کردنەوە بڵێ :

﴿ اللهم اني افضل ماتؤتي عبادك الصالحين ﴾

رواه البخاري و النسائي وابن السنى

( خـوایە گـیان باشـترین شـتم بدەیتـێ لەوانـەی دەیبەخـشیت بەپیاو چاکانی خۆت ).

## زیکری دوای نوێژ

### ١- دوای نوێژ تەواو بوون بڵێ :

ا- ﴿ اسـتغفر الله ، استغفر الله ، استغفر الله ، اللهم انت السلام ومنك السلام تباركت ياذا الجلال والاكرام﴾ اخرجه مسلم

( خـوایە گیان ، داوای لێخۆش بوونت لێدەکە ( سێجار ) ، خوایە گـیان تـۆ سـەلامی و سـەلامیش هەر لەتۆوە یە ، هەر خۆت بەرز و بڵندی ئەی خاوەن شکۆ و بەڕێز ).

ب- ﴿ اللهم لامانع لما اعطيتَ، ولا معطي لما منعت ولا ينفع ذا الجد منك الجد ﴾ متفق عليه

( خـوایە گـیان هـیچ ڕێگـرێك نیـیە لەبـەر دەم ئـەوەی تـۆ دەیبەخشیت ، وەهیچ کەس ناتوانێت شتێك ببەخشێت کە تۆ ڕێت لێگـرتبێ ، بەڕاسـتی خـاوەن تـواناو دەسـەڵاتەکانیش دامـاو بـێ دەستن لەخزمەتتدا ).

ج- ﴿ اللهم اعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك ﴾ رواه ابوداود والنسائي باسناد صحيح

( پـەروەردگارا ... یارمەتیم بدە و کۆمەکیم بکە لەسەر یاد و سوپاس کردنی خۆت ، وەلەسەر پەرستنی خۆت بەجوانترین شێوە ).

د- ﴿ قـــال رســـول الله ﷺ من سبح الله في دبر كل صلاة ثلاثاً وثلاثـــين ، وحمد الله ثلاثاً وثلاثين ، وكبر ثلاثاً وثلاثين ، وقال تمام المـــئة : لااله الا الله وحده لاشريك له ، له الملك وله الحمد ، وهو على كل شئ قدير ﴾ غفرت خطاياه وان كان مثل زبد البحر اخرجه مسلم

( پێغەمـبەری خـوا ﷺ فەرمویەتـی : ﴿ هەرکەسێك پاش هەموو نـوێژێك سی و سێ جار بڵێ ( سبحان الله ) ، وە سی و سێجار بڵێ ( الحمد لله ) ، وە سـی و سـێجار بڵـێ ( الله اکبر ) ، پاشانیش بۆ تـەواو کردنـی سـەدەم بڵـێ : هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەخوای تـاك و تەنـیا و بـێ شـەریك ، موڵك وماڵ و سپاس و ستایش هەر

بۆئەوە ، هەر خۆشیەتی دەسەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ ئەوا خوای گەورە لەگوناهەکانی خۆش دەبێت گەرچی بەوێنەی کەفی سەر دەریا بێت .)

## زەکات و ڕۆژو حەج

### ١- لەکاتی زەکات داندا بڵێ :

﴿ ربنا تقبل منا انك انت السميع العليم ﴾ البقرة : ١٢٧

( پەروەردگارا لێمان وەربگرە بەڕاستی تۆ بیسەر و زانای) .

### ٢- بازەکات وەرگریش بڵێ :

﴿ اجرك الله فيما اعطيتَ ، وجعله لك طهوراً ، وبارك فيما ابقيت ﴾
الاذكار: ١٦٩

( خوای گەورە پاداشتی ئەو بەخششەت بداتەوە ، وەخوای گەورە بیکاتە پاکەرەوە بۆ گوناهەکانت ، وەفەڕو بەرەکەت بکاتە ئەوماڵەیشی لات ماوەتەوە ).

### ٣- لەکاتی بینینی مانگ لە سەرەتاوە بڵێ :

﴿ الله اكبر ، اللهم اهله علينا بالامن والايمان والسلامة والاسلام، والتوفيق لما تحبه وترضاه ، ربنا وربك الله ﴾

رواه الطبراني وخرجه الترمذي والدارمي وقال الترمذي : حديث حسن

( الله اكبر ، خـوایە گـیان ئـەم مانگـەمان بـۆ نـویٚ بکـەرەوە بەئاسـایش و هێمنـی و ئـیمان ، وەبەسـەلامەتی و ئیـسلام ، وەیارمەتـیمان بدە و ئـەوەی پـێت خۆشـە و لیٚـی ڕازیت بۆمانی ئاسان بکە ، ئەی مانگ ... پەروەردگاری من و تۆ هەر خوایە).

## ٤- لەکاتی ڕۆژو شکاندندا بڵیٚ :

ا- ﴿ اللهم لك صمتُ وعلى رزقك افطرت ﴾ رواه ابوداود

( خوایە گیان تەنها بۆ تۆ بەڕۆژ و بووم ، وەلەسەر ڕزق و ڕۆزی تۆ بەربانگم کردەوە ).

ب- ﴿ ذهـب الـضمأ ، وابـتلتِ العـروق ، وثـبتَ الاجر انشاء الله ﴾ حديث حسن رواه ابوداود والنسائي

( تینوێتـی نـەما و ڕۆیـشت ڕەگـەکان تێـر ئـاو بـوون ، پاداشتەکەیش بەوویستی خوا جێگیربوو).

## ٥- گەر لەماڵێکی موسڵماندا ڕۆژوت شکاند دوعا یان بۆ بکە و بڵیٚ:

﴿ افطـر عندكم الصائمون ، واكل طعامكم الابرار ، وصلت عليكم الملائكة ﴾ رواه ابوداود وغيره باسناد صحيح

( یاخـوا ڕۆژوانـەکان لاتـان بـەربانگ بکەنـەوە ، وەپیاوچـاکان نانتان بخۆن و فریشتەکانیش دوعای خێر وبەرەکەتتان بۆ بکەن).

**٦- دوعا لەشەوی بەفەڕدا : (( ليله القدر )) :**

﴿ اللهم انك عفو - كريم - تحب العفو فاعفوا عني ﴾

رواه الترمذي والنسائي وابن ماجة باسانيد صحيحة

( خـوایه گـیان بەڕاسـتی تـۆ لێـبوردەی _ وەبەخـشندەی _ لێبوردنیـشت پـێ خۆشـه ، دەی خـوایه گـیان لـێم بـبوره و لـێم خۆش ببه ).

**٧- لەکاتی حەجدا : گەرچوویته حەرەمی مەکەی پیرۆزەوە بڵێ :**

ا- ﴿اللهم هذا حرمك وامنك ، فحرمني على النار وامني من عذابك يوم تبعث عبادك، واجعلني من اوليائك واهل طاعتك﴾

الاذكار ص : ١٧٥

( خـوایه گـیان ئەمـه شـوێنی قەدەغەكـراوی تـۆیه لەخـراپه و شـوێنی ئاسایـشی یـه ، دەی خـوایه گیان قەدەغەم بکە لەچوونە نـاو ئاگـر و ئەمیـنم بکـه لـەئازار و سـزای ئـەو ڕۆژەی بەنـدەکان زیـندوو دەکەیـتەوە ، وەبم کـه بەیەکـێك لەخۆشەویستان و ئەهلی گوێ ڕایەڵی کردنت ).

**٨- گەر کەسێك چوو بۆ حەج پێی بڵێ :**

﴿ زودك الله التقوى ، ووجهك في الخير، وكفاك الـ

رواه ابن السنى

( خـوای گەورە توێشوی تەقوات پێ ببەخشێت ، ڕوو و خێرت بکات و خەمەکانت لەسەر لابەرێت ).

**٩- کاتێکیش گەڕایەوە لەحەج پێی بڵێ :**

﴿ قبل الله حجك ، وغفر ذنبك ، وأخلف نفقتك ﴾

رواه ابن السني وفي اسناده مقال

( خوا حەجت لێ قبولێ بکات و لەگوناهت خۆش بێت و سەرفیاتی ڕێگات بۆ پڕبکاتەوە ).

# نوێژە تایبەتیەکان

**١- نوێژی تەسبیح :** (( صلاة التسبيح )) چوار ڕکاتە ، دەتوانرێت دوو ڕکات دوو ڕکاتیش ئەنجام بدرێت .

**شێوازی ئەم نوێژە :**

هەروەك نوێژی ئاسای وەهایە ، بەلاَم تەسبیحاتی زیاتری تیا دەکرێت ، بەم شێوەیە : سورەتی ( **فاتحة** ) بخوێنەوە پاشانیش سورەتێك ، ئەوجا هەر بەپێوە ( ١٥ ) جار بلێ ( سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر ) . پاشانیش بچۆرە ڕکوع و دەجار بلێ : ( سبحان الله ، والحمد لله ولااله الاالله و الله اكبر) ( ١٠ جار ) .وەپاشانیش هەستەرەوە و ( ١٠ جاری ) تریش هەمان زیکر بلێ ...

لەکاتی کڕنۆشدا ( ١٠ جاری ) بیلێرەوە ، لەنێوان کڕنوشەکانیشدا هەر ( ١٠ جار ) بیلێرەوە ، لەکڕنوشی دووەمیشدا ( ١٠ جار ) دوبارەی بکەرەوە ، دوای کڕنوشی دووەمیش پێش هەستانەوە بۆ ڕکاتی دووەم ( ١٠ جار ) دووپاتی بکەرەوە .

جا ئەمەیش ( ٧٥ جار ) لەڕکاتێکدا ، واتە : ( ١٥٠ ) لەدوو ڕکاتدا ، کەدەکاتە ( ٣٠٠ جار ) لەهەر چوار ڕکاتەکەدا .

خۆ ئەگەر سەهوی کرد ئەوا پێویست ناکات لەکڕنۆشی سەهودا تەسبیحاتی تر بکات ). رواه الترمذي وابن ماجه

**تێبینی :**

لەسەر ئەم ڕیوایەتە لەنوێژی ( صلاە التسبیح ) دا هاتووە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایاندا ، هەندێك دەڵێن : فەرمودەکە لاوازە و کاری پێ ناکرێت ، هەندێکیش کاری پێ دەکەن ، ئێمە لەسەر ڕای ئیمامی نەوەوی باسمانکردوە کە دەفەرموێت : **((قلت وقد نص جماعة من ائمة اصحابنا على استحباب صلاة التسبيح هذه ، منهم ابو محمد البغوي وابو محاسن الروياني – وكذلك ابن المبارك – )) .**

( بەڕاستی کۆمەڵێك لەزانایانی هاوڕێمان ( زانایانی شافیعی ) دانیان ناوە بەسونەتی ئەم ( صلاە تسبیح ) ە دا ، لەوانە ئەبو محمدی بەغەوی و ئەبو مەحاسن و بەهەمان شێوە ئیبن موبارەکیش ) .

**ئیبن و موبارەك دەفەرموێت** : (( لەرکوع دادەڵێت : ( **سبحان ربی العظیم** ) ئەوجا زیکرەکان دەکات بەهەمان شێوەش لەسوجدەیشدا ( **سبحان ربی الاعلی** ) بڵێ ئەوجا زیکرەکە بکە )) .

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموی : ﴿ ئەگەر ئەم نوێژە ئەنجام بدەیت ئەوا خوای گەورە لەگوناهت خۆش دەبێت گەرچی بەئەندازەی لمی بیابان بێت ﴾ . جا ئەگەر توانیت هەموو ڕۆژێك بیکە وەگەر نا ئەوا لەهەفتەیەکدا جارێك بیکە وەگەر نەوتوانی ئەوا لەمانگێکدا ، گەر نەشت توانی ئەوا لەساڵێکدا جارێك بیکە .

بڕوانە : الاذكار لا ١٦٧– ١٦٨.

**٢- نوێژی پێویستی : (صلاة الحاجة) :**

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : ﴿ هەركەسێك پێویستیەكی تایبەتی هەبوو لای خوای گەورە ، یا خود لای كەسێك لەنەوەی ئادەم ، ئەوە با دەس نوێژێكی جوان و پاك بگرێت ، پاشانیش دوو ڕكات نوێژ بكات ، دوایی سوپاسی خوا بكات و سەلأوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ و ئەوجا بڵێت :

( لا اله الا الله الحليم الكريم ، سبحان الله رب العرش العظيم الحمد لله رب العالمين ، اسألك موجبات رحمتك وعزائم مغفرتك ، والعصمة من كلِ ذنب والغنيمة من كل بر ، والسلامة من كل اثم ، لا تدع لي ذنباً الا غفرته ، ولا هماً الا فرجته ، ولا حاجة هي لك رضى الا قضيتها ، يا ارحم الراحمين .. )

پاشان با داوای فرمانی دونیا و قیامەت بكات چونكە خوای گەورە بۆی دابین دەكات ﴾ اخرجه الترمذي والنسائي وابن ماجة وفي اسناده مقال.

واتای دوعاكە : (( هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەخوا كەبە حیلم و بەخشندەیە ، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی پەروەردگاری عەرشی گەورە یە ، سوپا و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهان ، داوای هۆكاری ڕەحم و بەزەیت لێ دەكەم و داوای هۆكاری پێویست بوونی لێخۆش بوونت لێدەكەم ، داوات لێ دەكەم بمپارێزیت لەهەموو گوناهێك ، وەداوای بەشت لێدەكەم لەچاكەدا

و داوای سەلامەتیت لێدەکەم لەهەموو تاوانێك ، خوایە گیان هیچ گوناهێکم مەهێڵە و لێم خۆش ببە ، وەهەموو خەمێکم لەسەر لابەرە ، هەر پێویستیەکم هەیە کە ڕەزامەندی تۆی تێدابێت بۆم بهێنەرە دی ، ئەی بەسۆزترین بەسۆزەکان )) .

**٣- نوێژی ( استخارە ) سەر پشك کردن :**

پێغەمبەری خوا دەفەرموێت : ﴿ ئەگەر یەکێك لەئێوە ویستی کارێك ئەنجام بدات – هەرکاریك بێت – ئەوا بادوو ڕکات نوێژی سونەت بکات و پاشانیش دوای نوێژ بڵێت :

( اللهم اني استخيرك بعلمك ، واستقدرك بقدرتك ، وأسألك من فضلك العظيم ، فانك تقدر ولا أقدر ، وتعلم ولا أعلم وانت علام الغيوب ، اللهم ان كنت تعلم ان هذا الامر – ويسمي حاجته – خير لي في ديني ومعاشي وعاقبة امري . (أوقال ): عاجله واجله ، فاقدره لي ويسره لي ثم بارك لي فيه ، وان كنت تعلم ان هذا الامر شر لي في ديني ومعاشي وعاقبة امري ، (أو قال ) عاجله واجله فاصرفه عني واصرفني عنه ، واقدرلي الخير حيث كان ثم ارضني به ). ﴾ رواه البخاري

( خوایە گیان داوای ڕاوپژت لێ دەکەم بەزانینی خۆت وەداوای هێزت لێدەکەم ، داوات لێدەکەم بەفەزڵی گەورەییت بەڕاستی تۆ توانات هەیە ومن بێ توانام ، وتۆ زانایت و من نازانم ، تۆ ئاگادار

و زانای بەهەموو نادیارەكان ، خوایە گیان ئەگەر ئەو ئیشەی نیازمە بیكەم – ناوی كارەكەت بهێنە – خێری دین و ژین و سەرەنجامی ژیانمی تیایە – ( یاخود ) خێری دونیا و ئاخیرەتی تێدایە ئەوا بۆ م بنوسە و بۆم ئاسان بكە ئەوجا بەرەكەت و فەڕی تیّ بكە بۆم . خوایە گیان تۆ زانایت ئەگەر ئەو ئیشەی نیازم هەیە بیكەم شەڕو خراپەی تێدایە بۆ دین و ژین و سەرەنجامی ژیانم (یاخود ) شەڕی دنیا و ئاخیرەتی تێدایە ... ئەوا لێمی لابدە و منیش لەو لابدە ، وەچاكەم بۆ بنووسە هەر چۆنە و لەهەر جێگەیەك هەیە وەپاشانیش ڕازیم بكە پێی) .

## ٤- نوێژی مردوو :

### نوێژی مردو فەرزی كیفایەیە دوای شۆردن و كفن كردنی مردوەكە دەكرێت . ئەویش بەم شێوازەی لای خوارەوە :

١- نیەتی نوێژی جەنازەی لیّ دێنیت و ( الله اكــبر ) دەكەیت پاشانیش سورەتی ( الفاتحة ) دەخوێنیت .

٢- پاشان ( الله اكبر ) دەكەیت و ئەوجا دەڵێت : ( اللهم صلي علی محمد وعلی اله محمد ) .

٣- ( الله اكبر ) دەكەیت و ئەوجا دوعا بۆ مردوەكە دەكەیت وەك باسی دەكەین .

٤- دواجار ( الله اکبر ) دەکەیت و پاشانیش دەڵێیت : ( اللهم لاتحرمنا أجره ولا تفتنا بعده واغفر لنا وله ) رواه ابوداود

٥- پاشانیش هەر بەپێوە بەلای ڕاست و چەپدا سەلام دەدەیتەوە .

**تێبینی** : لەکاتی ( الله اکبر ) ە کاندا سوننەتە دەست بەرزبکەیتەوە .

## دوعا ی نوێژی مردو

*** گەر مردووەکە بالغ بوو لەنوێژەکەدا ئەم دوعایەی بۆ بکە :**

( اللهم اغفر له وارحمه وعافيه واعف عنه واكرم نزله ووسع مدخله وأغسله بالماء والثلج والبرد ، و نقه من الخطايا كما ينقي الثوب الابيض من الدنس و ابدله داراً خيراً من داره وأهلاً خيراً من أهله وزوجاً خيراً من زوجه ، وأدخله الجنة، وقه فتنة القبر وعذاب النار) . رواه مسلم

( خوایەگیان لێی خۆش ببە و ڕەحمی پێبگە و بارسوکی بکە، و ڕێزداری بکە و شوێن و جێگەی فراوان بکە ، و بشۆو پاکژی بکەروە بەئاوی بەفر و باران و تەرزە وە پاکی بکەروە لە گوناه و تاوانەکانی وەك چۆن کراسیچك پاکژ دەبێتەوە لەپیسی ، وجێنشینی بکە لەماڵێکدا خۆشتر لەماڵەکەی خۆی ، وە

لەخێزانێكدا باشتر لە خێزانەكەی خۆی ، و بیخەرە بەهەشت و دووری بخەروە لەفتنەی گۆڕو ئاگری دۆزەخ) .

یاخود بڵێ : ﴿ اللهم اغفر له وارحمه ﴾

## * ئەگەر مردووەكە منداڵ بوو ئەوا لەنوێژەكەدا ئەم دوعایەی بۆ بكە :

(( اللــــهم اجعلــــه فرطاً لأبويه وسلفاً وزخراً و عظة واعتباراً و شفيعاً، و ثقل به موازينهما ، وافرغ الصبر على قلوبهما ، ولاتفتنهما بعده ولا تحرمهما أجره )) .

( خـوایە گیان بیكەرە پێشوازی كارێك بۆ دایك و باوكی و بیكەرە پێـشەنگ و توێـشوو و پەنـد و جـێگەی ڕێـز و شـفاعەت كـار، وەكێـشانەی دایـك و باوكـی پـێ سـەنگین بكـە ، ئارامـی ببەخـشە بـەدایك و باوكـی ، لـە دوای ئەویـشەوە تووشـی فتـنەیان مەكـە و لەئەجرو پاداشتی ئەو كۆرپەیەش بێ بەشیان مەكە) .

# كاتی نان خواردن

## ١- سونەتە لەبەردەم خۆتەوە و بەدەستی ڕاست نان بخۆیت :

### ا- سەرەتای نان خواردن ناوی خوا بێنە و بڵێ :

﴿ بسم الله ﴾ اخرجه ابوداود والترمذي

( بەناوی خوا).

ب- ئەگەر لەسەرەتاوە لەبیرت چوو لەو نێوانەدا بڵێ :

﴿ بسم الله في اوله واخره ﴾

اخرجه ابوداود والترمذي وقال حديث حسن صحيح

(بەناوی خوا لەسەرەتا و کۆتاییدا) .

ج- وەهەر لەسەرەتاوە ئەم دوعایە بڵێ :

﴿ اللهم بارك لنا فيما رزقتنا وقنا عذاب النار ﴾ رواه ابن السنى

( خوایە گیان بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیمانەوە و لەئازار و ئەشکەنجەی ئاگری دۆزەخ بمان پارێزە) .

**٢- پاش نان خواردن بڵێ :**

﴿ الحمد لله الذي اطعمنا وسقانا وجعلنا من المسلمين ﴾

رواه احمد وابوداود والترمذي والنسائي وابن ماجه وهو حديث حسن

( سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیم و کردینی بەموسوڵمان) .

**٣- گەر لە ماڵێك بویت و نانت خوارد ئەم دوعایە بڵێ :**

﴿ اللهم بارك لهم فيما رزقتهم واغفر لهم وارحمهم ﴾ رواه مسلم

( خوایە گیان بەرەکەت بخەرە رزق و رۆزیانەوە و لێیان خۆش ببە و رەحمیان پیبکە) .

**٤- گەر کەسێك ئاوی دایتێ دوعای خێری بۆ بکە بڵێ :**

﴿ اللهم اطعم من اطعمني واسقِ من سقاني ﴾ رواه مسلم

( خوایە گیان خۆراك ببەخشە بەوەی خواردنی دا پێم ئەو کەسەیش پاراو بکە کە منی پاراو کرد) .

### ٥- دوای ئاو خواردنەوە بڵێ :

﴿ الحمـــد لله الـــذي جعله عذباً فراتاً برحمته ولم يجعله ملحاً اجاجاً بذنوبنا ﴾

( سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم ئاوەی شیرینو خۆش کردوە بەرەحم و میهرەبانی خۆی ، وەنەی کردوە بە ئاوێکی بێتامیێ سوێر بەگوناهی خۆمان ).

### ٦- مەجلیس بباسی خێر و چاکەی تێدابکرێت :

قال رسول الله ﷺ : ﴿ مامن قوم يقومون من مجلس لا يذكرون الله تعالى فيه الا قاموا عن مثل جيفة حيمار وكان لهم حسرة ﴾

رواه ابوداود باسناد صحيح

( پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی : هەر کۆمەڵە خەڵکێك لە مەجلسێکدا هەستن کەزیکر و یادی خوای تیا نەکرێت ، ئەوا وەك ئەوە وایە لەسەر لاکە تۆپیوی گویێ درێژێك هەڵسابن ، وەش بێتە پەشیمانی و داماوی بۆیان ).

### ٧- لەکاتی هەڵسان لەمەجلیسدا بڵێ :

﴿ سـبحانك اللهم وبحمدك ، اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك ﴾ رواه ابوداود و الترمذي والحاكم وقال الترمذي : حديث حسن صحيح

( پاك و بێگەردی و سوپاس هەر بۆ تۆیە خوایەگیان ، شایەتی ئەدەم کە تۆ تاك و تەنهایت ، داوای لێخۆش بونت لێدەکەم وە دەگەڕێمەوە بۆلات و تەوبە دەکەم ).

## لەکاتی نارەحەتیدا

### ١- لەکاتی بێ تاقەتیدا ئەم دوعایە بکە :

﴿ لااله الا الله العظيم الحليم ، لا اله الا الله رب العرش العظيم ، لا اله الا الله رب السماوات ورب الارض رب العرش العظيم ﴾

( هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەخوای گەورە و حەلیم ، وەهیچ پەرستراوێك نییە جگە لەپەروەردگاری عەرشی گەورە و مەزن ، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و عەرشی بەڕێز ). رواه البخاري ومسلم

### ٢- لەکاتی دڵ تەنگی و نارەحەتیدا بڵێ :

ا- ﴿ يا حي ياقيوم برحمتك استغيث ﴾ رواه الترمذي ، حديث صحيح

( ئەی پەروەردگاری زیندو بەدەستەڵات داوای کۆمەکی ڕەحمی تۆ دەکەم)

ب- ﴿ لا اله الا انت سبحانك اني كنت من الظالمين ﴾

رواه الترمذي

( خوایە گیان هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەتۆ ، پاگ و بێگەردی بۆ تۆ ، بەڕاستی من لەهەڵەکاران بووم ).

### ٣- لەکاتی ترسان لەشتێك بڵێ :

﴿ اعــوذ بكلمات الله التامة من غضبه وشر عباده ، ومن همزات الشياطين وان يحضرون ﴾ رواه ابو داود والترمذي

( پەنا دەگرم بەفەرمایشتە راست وتەواوەکانی خوای گەورە لەتوڕەیی خۆیی و شەڕی بەندەکانی ، ولە وەسوەسە و خەتەرەی شەیتانەکان وەخوایە گیان پەنات پێ دەگرم لەوەیش کە ئامادەبن ).

### ٤- لەکاتی ترسان لەکەسێك یان کۆمەڵەکەسێکی ستەمکار بڵێ :

﴿ اللهم انا نجعلك في نحورهم ونعوذبك من شرورهم ﴾

رواه ابوداود والنسائي باسناد صحيح

( خـوایە گـیان ئـێمە ئـەوان ڕەوانـەی لای تـۆ دەکـەین ، وەپەناشت پێ دەگرین لەشەڕو ئاژاوەیان ).

### ٥- گەر کارێکی گرنگت بەسەردا کەوت دوودڵ مەبە و بڵێ :

﴿ حسبي الله ونعم الوكيل ﴾ رواه ابوداود حديث حسن

( بەسە خوای گەورە یاریدەدەرم بێت و هەرخۆیشی باشترین وەکیلە ).

### ٦- لەکاتێکدا کارێکت لا گران بوو بۆت نەکرا بڵێ :

﴿ اللـهم لاسهل الا ما جعلته سهلاً وانت تجعل الحزن اذا شئت سهلا ﴾

رواه ابن السنى وابن حبان حديث صحيح

( خوایە گیان هیچ شتێك ئاسان نییە ئەوە نەبێت تۆ ئاسانت کردوە ، هەر تۆش کاری قورس و گران ئاسان دەکەیت گەر وویستت لێی بێت شاخ و کێو دەکەیتە دەشت ).

**٧- لەکاتێکدا ژیانت بەرێوە نەدەچوو بڵێ :**

﴿ اللــــهم رحمتك أرجو فلا تكلني الى نفسي طرفة عين وأصلح لي شأنه كله لا اله الا أنت ﴾ رواه ابوداود

( خوایە گیان داوام ڕەحمی تۆیە ، بۆ تەنها ساتێکیش مەم سپێرە بەخۆم ، و هەموو باری ژیانم باش بکە ، تەنها خۆت پەروەردگار و تاك و تەنهایت).

**٨ - گەر نیعمەتێکت بەسەرا ڕژا لەماڵ و منداڵ و سامان بڵێ :**

﴿ ماشاء الله لاقوة الا بالله ﴾ رواه ابن السنى

( ویستی خوا چۆنە و چەند جوانە ... هەموو هێزێك هەر لای خوایە ).

**٩- لەکاتێکدا ناخۆشیەکت بەسەردا هات بڵێ :**

﴿ انا لله وانا اليه راجعون ﴾ البقرة : ١٥٦

( ئێمە هەموو موڵکی خواین و بەتەنها هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە ).

**١٠- لەکاتی قەرزاریدا ئەم دوعایە بکە :**

﴿ اللــــهم اكفــــني بحلالك عن حرامك ، واغنيني بفضلك عمن سواك ﴾ رواه الترمذي ، حديث حسن

( خوایە گیان وام لێبکەیت کە حەڵاڵ بەشم بکات و نەچمە سەر حەرام کراوەکان ، وەبێ‌پیویست و دەوڵەمەندم بکە تا پێویستیم بەکەس نەبێت جگە لەخۆت ).

## ١١- لەکاتێکدا هەست بەتەنهای و نامۆی کرد بڵێ :

﴿ اعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه وشر عباده ومن همزات الشياطين وان يحضرون ﴾ رواه ابوداود والترمذي

( پەنا دەگرم بەفەرمایشتە ڕاست و دروستەکانی خوای گەورە لە توڕیی و سزای خوای گەورە و شەڕی بەندەکانی ، وە پەنادەگرم بەخوای گەورە لە وەسوەسەی شەیتانەکان و ئامادەبونیان ).

## ١٢- لەکاتی تووش بوونی وەسوەسەدا یادی خوا بکە و بڵێ :

﴿ اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم ﴾

النحل : ٩٨

( پەنا دەگرم بەخوای گەورە و زانا وبیسەر لەشەیتانی بەد بەختی نەفرین لێکراو ).

## ١٣- لەکاتی جەنگ لەگەڵ بێباوەڕاندا بڵێ :

﴿ لا حول ولاقوة الا بالله العزيز الحكيم ، ماشاء الله لاقوة الا بالله، اعتصمنا بالله استعنا بالله ، توكلنا على الله ﴾ الاذكار : ١٨٩

( هەموو جوڵە و گۆڕان و هێزێك هەربەویستی خوای بالاّ دەست و حەکیمە ، وویستی خوای گەورە چۆنە ! هەموو هێزێك

هـەر لای خـوایە ، پـشت بەستنمان هەر بەخوایە ، داوای کۆمەکی هەر لەخوا دەکەین و پەنا هەر بەخوا دەگرین ).

## ١٤- بۆ پاراستنی خۆت و منداڵ بڵێ :

﴿ اعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة ﴾ رواه البخاري

( پەنادەگـرم بە فەرمایشتە ڕاست و دروستەکانی خوای گەورە لەچەپۆکی شەیتان و هەموو چاوێکی پیسی گازندە ).

# لەکاتی سەفەردا

## ١- لەکاتی ڕۆیشتن بۆ سەفەر بەوانە بڵێ کە جێلیان ئەهێڵی :

﴿ استودعكم الله الذي لا تضيع ودائعه ﴾

رواه ابن السنى حديث حسن حسنه الحافظ وغيره

( بەخواتان دەسپێرم کەهیچ سپاردەیەکی زایە ناکات).

## ٢- لەکاتێکدا سواری سەیارە بویت بڵێ :

﴿ بسم الله، الحمد لله، سبحان الذي سخر لنا هذا وماكنا له مقرنين، وانا الى ربنا لمنقلبون ﴾ رواه ابو داود والترمذي والنسائي باسانيد صحيحة

( تـەنها بـەناوی خـوا سوپاس و ستایش بۆ خوا ، پاك و بێگەردی بـۆ ئـەو خوایەی ئەم هۆکارەی کردە خزمەتکارمان ، گەرچی ئێمە شـایەنی ئـەوە نەبـوین ، هەمـوو لایەکیـشمان بـەرەو لای ئـەو دەگەڕێنەوە) .

٣- لەسەرەتای سەفەرەکەتدا بڵێ :

﴿ اللـــهم انا نسألك في سفرنا هذا البر والتقوى ، ومن العمل ماترضى ، اللهم هون علينا سفرنا هذا ، واطو عنا بعده اللهم انت الصاحب في السفر والخليفة في الاهل، اللهم اني اعوذ بك من وعثاء السفر ، وكآبة المنظر ، وسوء المنقلب في المال والاهل ﴾ رواه مسلم

( خـوایە گـیان لـەم سەفەرەدا داوای تەقواو چاکەت لێ دەکەین، وەئەوەنـدەش کـردەوەی چـاکما پــێ ببەخـشە کەلێــی ڕازیــت، خوایەگــیان ئــەم ســەفەرەمان لا ئاســان بکــە و دووریەکــەی بپێچەرەوە لامان تا ناڕەحەت نەبین ، خوایە گیان هەر تۆ هاوڕێ سەفەرمانیت وەجێنـشینی لـەماڵ و خێزاندا ، خوایە گیان پەنات پــێ دەگـرم لەناڕەحەتیەکانــی ڕێگــا و ناشــرینی دیمەنــەکان و بەخراپی گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و خێزان).

٤- لەکاتــی گەڕانەوە لەسەفەرەکەت : ئـەم دوعایەی سەرەوە بڵێرەوە و پاشان بڵێ :

﴿ آيبون ، تائبون، عابدون ، لربنا حامدون ﴾ رواه مسلم

( گەڕینـەوە بەتۆبەکـردن و بەندایەتـی کردن و سوپاس کردنی خوای گەورە ).

٥- لەکاتێکدا سواری کەشتی بوویت بڵێ :

﴿ بسم الله مجراها ومرساها ان ربي لغفور رحيم ﴾ هود : ٤١

( بــه‌ناوی خــوایه‌ رۆیــشتن و وه‌ســتانه‌وه‌مان ، به‌ڕاســتی په‌روه‌ردگارمان لێبورده‌ و میهره‌بانه‌ ).

## ٦- كاتێك چوویته‌ جێگای چۆڵ و تێدا مایته‌وه‌ بڵێ :

﴿ اعوذ بكلمات الله التامات من شر ماخلق ﴾

حديث صحيح رواه مسلم والترمذي

( پـه‌نا ده‌گـرم به‌فه‌رمایـشته‌ راست و دروسته‌كانی خوای گه‌وره‌ له‌و شه‌ڕانه‌ی هه‌ن له‌ئارادا ).

به‌م شێوه‌یه‌ هیچ زیانێكت پێ ناگات تاله‌و جێگه‌یه‌ ده‌رده‌چیت.

## ٧ - كاتێك ویست له‌گوندێك یا له‌شارێك لابده‌ین بڵێ :

﴿ اللــهم رب السموات السبع وما أظللن والارضين السبع وما أقللن ورب الشياطين وما أضللن ، ورب الرياح وما ذرين ، اسالك خير هذه القرية وخير أهلها وخير مافيها ، ونعوذبك من شرها وشر أهلها وشر مافيها ﴾

روا النسائي والحاكم وابن السنى وقال حديث حسن

( خوایه‌ گیان ئه‌ی په‌روه‌ردگاری حه‌وت ئاسمانه‌كه‌ و ئه‌وه‌یشی له‌خـۆیان گرتووه‌ ، وه‌ په‌روه‌ردگاری حه‌وت زه‌وییه‌كه‌ و ئه‌وه‌یشی گرتویانه‌ته‌ خۆ ، په‌روه‌ردگاری شه‌یتانه‌كان و ئه‌وه‌شی سه‌ریان لێ شێواندوون ، په‌روه‌ردگاری باكان و هه‌ڵكردنیان ... داوای باشترین و چـاكترینی ئـه‌م گـونده‌ت لێ ده‌كـه‌م و داوای چـاكترینی خه‌ڵكیش و

باشترینی ئەوەی کەتێیدایەتی ، وە پەنات پێدەگرم لەخراپە و شەڕی ئەم گوندە و خراپەی خەڵكە كەی و ئەو خراپەیەشی کەتێیدایە ).

## ٨- کاتێك گەڕایتەوە بۆ وڵات و شوێنی خۆت :

﴿ اللهم اجعل لنا بها قراراً و رزقاً حسناً ﴾

رواه الطبراني حديث حسن

( خــوایە گــیان جــێگیرمان بکــە تێــیدا و ڕۆزی باشیــشمان پێببەخشە).

## ٩- گەر کەسێك لەغەزا گەڕایەوە پێی بڵێ :

﴿ الحمد لله الذي نصرك ، واعزك واكرمك ﴾

أخرجه مسلم والنسائي وأبوداود

( سوپاس بۆ ئەو خوایەی سەری خستیت و بەڕێز و سەرکەوتو سەرفرازی کردیت ).

# کاتی هاوسەر گرتن

## ١- هەرکەسێك هاوسەری گرت پێی بڵێ :

﴿ بارك الله لك وبارك عليك ، وجمع بينكما في خير ﴾

رواه ابوداو و الترمذي و ابن ماجة ، وقال الترمذي : حديث حسن صحيح

( خوای گەورە لێت پیرۆز کات و بۆت پیرۆز کات ، وە خوای گەورە كۆتان بكاتەوە و یەکتان بخات لەسەر خێر ).

### ٢- کاتی هاوسەر گواستنەوە بوترێت :

﴿ اللـــهم اني اسالك خيرها وخير ماجبلتا عليه ، واعوذبك من شرها وشر ما جبلتها عليه ﴾ رواه ابوداود وابن ماجة وابن السنى

( خـــوایە گـــیان داوای خێـــری ئـــەم هاوســـەرەت لـــێدەکەم ، ئەوخێرەشـــی لەســـەری پەروەردەبـــووە ، وە پـــەنات پـــێ دەگـــرم لەشەڕەکەی ئەو شەڕەشی لەسەری پەروەردەبووە).

### ٣- پێش چووونە لای هاوسەرەکەت :

﴿ بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان مارزقتنا ﴾

( بەناوی خوای گەورە ، خوایە گیان شەیتانمان لێ بەدوور بگرە، وەددووریشی بخەرەوە لەوەی پێت بەخشیوین ). رواه البخاري ومسلم

## کـــاتی نـــەخۆشی

### ١- کاتێك نەخۆش بویت :

#### ا- ئەم سورەتانە بخوێنە بەسەر خۆتتدا :

( الاخلاص ، الفلق ، الناس ) رواه البخاري ومسلم

#### ٢- دەس بخەرە سەر شوێنی ئازارەکە و بڵێ :

﴿ بسم الله ( ٣ مرات ) ، اعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر ( ٧ مرات ) ﴾ رواه مسلم

